
ناوی کتێب: داستانە کانی ڕۆستەمی زاڵ
بابەت: شەش داستان لەداستانەکانی ڕۆستەمی زاڵ
ئامادەکردن و وەرگێرانی: یاوەر محمد
دیزاینی ناوەوە: چوارچرا
شوێنی چاپ: چوارچرا
تیراژ: 5000
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم 2015

# زاڵ و سیمۆرغ

شاکارەکانی ئەدەبیاتی ئێرانی بۆ منداڵان و تازەلاوان

لەنووسینی ئۆمیدی پەناهی ئازەر
وێنەکێش: ئەمیری ئەکبەری



ڕۆژێك لەڕۆژان پاڵەوانێك بەناوی سام لەزابۆلستاندا فەرمانڕەوایی دەكرد. سام گەیشتبووە تەمەنی پیری ، بەڵام كوڕی نەبوو كە لەدوای خۆی ببێتە دەسەڵاتداری زابۆلستان. هەر بەو بۆنەشەوە زۆر دڵگران بوو. ڕۆژێك لەڕۆژان بەدڵی شكاوەوە ڕویكردە قاپی خوداو دۆعایەكی زۆری كردو داوای كرد خودا كوڕێكی پێ ببەخشێت. ماوەیەكی پێ چوو، ڕۆژێك لەو ڕۆژانە كە بۆ ڕاو چوو بوو، پەیامنێرێك پەیامێكی بۆی هێنا. پەیامنێر وتی: هاوسەری لاو و جوانت دووگیانە. بەم شێوەیە، هاوسەرەكەی پاش نۆ مانگ كوڕێكی بوو.



منداڵیکی تەندروست و بەهێز بوو، بەڵام لەش و قژی وەکوو بەفر سپی بوو. لەو سەردەمەدا، خەڵك پێیان وابوو ئەو منداڵانە چارە ڕەشی و بەدبەختی بەدوای خۆیاندا دێنن. هەر بەم بۆنەیەشەوە هیچکام لەدایەنەکانی کۆشکەکە نەیان وێرا هەواڵی لەدایکبوونی منداڵەکە بەسام رابگەیەنن.



لەنێو پەرەستارەکانی کۆشکەکەدا پیرێژنێکی هەڵکەوتە هەبوو، زۆر زانابوو. پیرێژن وتی: "دەرگاکان دابخەن. با بزانین چۆن ئەم هەواڵە بەسام رابگەیەنین." حەوت رۆژ لەرووداوەکە تێپەری ، لەرۆژی هەشتەمدا، پیرێژن وتی: "دەبێ خۆم بۆ لای سام برۆم و نەرمی بکەم." پیرێژن دواتر بۆ بینینی پاڵەوانەکە سەردانی کرد. ئەو وتی: "ئەی پاڵەوان سەرئەنجام کورێکتان بووە. کورێك کە وەکوو منداڵی شێر بەهێزە، بەڵام پرچەکانی وەکوو بەفرەو لەشی وەکوو زیو ئەدرەوشێتەوە." کاتێك سام ئەم هەواڵەی بیست شڵەژاو وتی: "چیت وت؟ پرچەکانی سپییە؟ دەمەوێت بیبینم." کاتێك منداڵەکەی بینی زۆر زۆر خوشحاڵ بوو، بەڵام وتی: "خوایە من چ تاوانێکم کردبوو کە منداڵێکی بەو جۆرەت بەمن داوە؟ ئەگەر کەسانی دیکە بی بینن چۆن بیر دەکەنەوە؟ نا! ئەم هەواڵە بەهیچ کەس رامەگەیەنن. بەهەمووان بڵێن منداڵەکەی سام بەمردوویی لەدایك بووە."



دوای ئەوە فەرمانی دا منداڵەکە بۆ کێوی ئەلبۆرز ببەن و هەر لەوێدا بەجێی بێڵن. ڕۆژی دوایی سەربازەکانی تایبەتی سام، فەرمانەکەیان بەجێ گەیاند. لەسەر لوتکەی کێوی ئەلبۆرزدا سیمۆرغێك هێلانەی کردبوو. ئەو ڕۆژە سیمۆرغ بۆ ڕاو هەڵفڕیبوو بۆ ئەوەی جوجکەکانی تێر بکات. لەپڕ چاوی بەمنداڵێك کەوت. سیمۆرغ لەداوێنەی کێودا نیشتەوەو منداڵەکەی بۆ هێلانەکەی برد. بەڵام کاتێك ویستی منداڵە ساواکە پارچە پارچە بکات، بەزەیی پێدا هاتەوە. سیمۆرغ وەکوو جوجکەی خۆی ئاگاداری لەو منداڵە کرد. ساڵانێك تێپەڕ بوو و منداڵ گەورەو بەهێز بوو.

شەوێك سام خەو دەبینێت كە پیاوێكی ئەسپ سوار دێتە خەوی و پێی دەڵێت: "ئەی پاڵەوان ئەو منداڵەی لەكێوی ئەلبۆرزدا بەجێت هێشتبوو، هێشتا زیندووە!" كاتێك سام لەخەو ڕاپەڕی، بیرمەندان و شرۆڤەكارانی نزیكی خۆی بانگهێشت كردو خەوەكەی بۆ گێڕانەوە. دواتر بۆیانی گێڕایەوە كە: "من چەندین ساڵ لەمەوپێش منداڵە ساواكەی خۆمم لەكێوی ئەلبۆرزدا بەجێهێشتووە بۆ ئەوەی لەوێدا بمرێت. چونكە پێم وابوو خەڵك گاڵتەم پێ دەكەن كوڕێكم بووە كە پرچەكانی سپی بووە." بیرمەندی گەورەی كۆشك هاتە پێشەوەو وتی: "ئەی پاڵەوان هەموو گیان لەبەرێك ئاگای لەمنداڵەكەی خۆی دەبێت، ئێوە چۆن دڵتان هات منداڵە بێ تاوانەكەی خۆتان بەتاق و تەنیا لەكوێستاندا بەجێ بێڵن؟" سام سەری دانەواندو وتی: "ئەو كات پێم وابوو ئەو منداڵە چارەڕەشیمان بۆ دێنێت، بەڵام ئێستا دەزانم كە ئێوە ڕاست دەكەن، نازانم چی بكەم؟..." دواتر كەمێك بێ دەنگ بوو و درێژەی بەقسەكانی دا:




"پێتان وایە ئەو منداڵە لەسەرماو سەهۆڵبەندانی کوێستانداو لەنێو ئەو
هەمووە ئاژەڵە دڕندەدا هێشتا زیندووە؟" بیرمەند وتی: "ئەگەر چارەنووس
کەسێك زیندوو ڕابگرێت، بەدڵنیاییەوە دەتوانێت زیندوو بێت. دەبێ بەخێرایی
بیدۆزنەوە." سام وتی: نا! لەوە ناچێت زیندوو مابێت!"



وا ڕێکەوت شەوی دواتریش هەر ئەو خەوەی بینی. لەخەویدا لاوێك بەسوپایەك سەربازەوە بەرەو ئەو دەهات. هاوڕێیەکی لاو وتی: "ئەی پاڵەوان لەخۆت شەرم ناکەی. تۆ چ پاڵەوانێکی کە دەبێ سیمۆرغێك ئاگای لەمنداڵەکەت بێت! ئەگەر پرچی سپی یەو چارەرەشی دێنێت، خۆ تۆ سەرجەم پرچەکەت سپی یە، خۆ ئەگەر وابێت تۆ لەهەموو کەسێك خراپتری. ئەوەش بزانە کە کورەکەت وەکوو پاڵەوانێك لەنێو ئەو کێوانەدا دەژی."
سام کە زۆر ترسابوو لەخەو راچڵەکاو لەگەڵ هاوڕێیانیدا بەرەو کێوی ئەلبۆرز چوو. لەسەر ئەو کێوەدا، لاوێکی بینی وەکوو پاڵەوان راوەستابوو و چاوی لەوان دەکرد.
سام ویستی لەکێوەکە بچێتە سەرەوە، بەڵام نەیتوانی و بارگران و خەمگین بوو و چۆکی داداو لەزەویدا بۆی کەوت. هەر لەو کاتەدا سیمۆرغێك هەڵفڕی و سامی لەگەڵ هاوڕێیانیدا بینی.

سیمۆڕغ گەڕایەوەو بەزاڵی وت: "ئەو دەسەڵاتدارە پاڵەوانە باوکی تۆیە، ئیتر کاتی ئەوەیە بڕۆیت و لەگەڵ مرۆڤەکاندا بژیت. من ئاگاداریم لێ کردی، ئەرکی خۆم بەجێ گەیاندووە. ناوی داستانم لەسەرت داناو فێرم کردی چۆن لەگەڵ مرۆڤەکاندا قسە بکەیت. ئەوەش بزانە کە زۆرم خۆش دەوێت." داستان وتی: "وادیارە ئیتر لەمن ماندوو بووی؟" سیمۆڕغ وتی: "ئیتر کوێستان جێگای تۆ نییە، کوڕم. باوکی تۆ دەسەڵاتداری زابوڵستانەو پاڵەوانی پاڵەوانانە. تۆ دەتوانی کاری گەورە بکەیت." پاشان باڵێکی خۆی دەرهێناو بەزاڵی داو پێی وت: "هەر کاتێك لەژیاندا تووشی کێشە بوویت، کەمێکی لێ بسووتێنی تا بێم بەهاناتەوە. هەر کاتێك ویستت سەردانی من بکەیت، لەخزمەتتدام." سەرئەنجام داستان ملی پێ دا.



سیمۆرغ بەچنگی زاڵی گرت و هەڵفڕی و لەکێوی ئەلبۆرزەوە بەرەو خوارەوە هات و نیشتەوە. سام و هاوڕێیانی لەبینینی سیمۆرغی زەبەلاح سەریان سووڕما بوو. سیمۆرغ تەپ و تۆزێکی وای کرد کە هەمووان لاچوون. پاشان بەهێمنی داستانی لەسەر زەوی داناو سەرلەنوێ هەڵفڕی. سام بەخێرایی کوڕەکەی لەئامێز گرت و بەگریانەوە ڕووخساری ماچ کرد. ئەو وتی: "کوڕم لێم ببوورەو ڕابردوو لەبیر بکە. من ناوی زاڵت لێ دەنێم و لەمڕۆ بەولاوە هەرچیت بووێت بۆتی دابین دەکەم."





پاشان سام جلێکی پاشایانە کە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، و فیلێکی گەورەو سپی بەزاڵ بەخشی. ئەوان لەنێو شایی و هەڵپەرکێدا زاڵیان بۆ زابوڵستان هێنایەوە. سام جەژنێکی گەورەی ڕێکخست. تەواوی خەڵك لەو جەژنەدا بەشداریان کرد. بۆ ماوەی چەندین ڕۆژ دەستیان دایە رابواردن و شایی و هەڵپەڕکێ. کاتێك ئەو هەواڵە بەمەنوچێهر پاشای ئێران گەیشت، ئەویش کورەکەی، واتە نەوزەری بۆ زابوڵستان نارد بۆ ئەوەی پیرۆزبایی بکات و لەگەڵ زاڵدا بۆ کۆشکەکەی خۆی بانگهێشتی بکات.

کۆتایی

چیرۆکە خۆشەکانی شانامە

# منداڵی ڕۆستەم و قەڵای سپەند

شاکارەکانی ئەدەبیاتی ئێرانی بۆ منداڵان و تازەلاوان



هێشتا چەند ڕۆژ لەزەماوەندی زاڵ و ڕوودابە تێ نەپەڕیبوو، ڕوودابە دووگیان بوو و پاش نۆ مانگ کاتی منداڵبوونی گەیشت. بەڵام ڕوودابە ئازارێکی زۆری هەبوو نەیدەتوانی منداڵەکەی ببێت. زاڵ فەرمانی دا کە هەموو پەرەستارە شارەزاکان بۆ ئەوێ بنێرن بۆ ئەوەی ڕوودابە ڕزگار بکەن. بەڵام هیچ کامیان کارێکی ئەوتۆیان پێ نەکرا تا ئەوەی کە زاڵ سیمۆرغی بیر کەوتەوە. ئەو تۆزێک لەپەڕی سیمۆرغی ئاگر تێبەردا. لەپڕ ئاسمان لێڵ و تاریک بوو و سیمۆرغ بەباڵ لێدان سەری هەڵدا. سیمۆرغ لەزاڵی پرسی: "چ ڕووداوێک قەوماوە وا منت بانگهێشت کردووە؟" زاڵ وتی: "ڕوودابە ناتوانێت منداڵەکەی ببێت. دەترسم بمرێت!"





سیمۆرغ وتی: "ئاگاداربه ئەم منداڵە منداڵێکی ئاسایی نییە، ئەو منداڵە لەداهاتوودا وەکوو شێر بەهێز و ئازا دەبێت." پاشان فێری کرد کە چۆن لەشیرەی رووەکەکان شەربەتی هۆشبەر ساز بکات و بەروودابەی بدات بۆ ئەوەی لەسەرخۆی بچێت. سیمۆرغ وتی: "کاتێك روودابە لەسەرخۆی چوو، دەبێ پزیشکێك ئاگاداری لێ بکات و منداڵەکە بێنێتە دەرەوە." زاڵ شڵەژابوو، وتی: "بەڵام دەترسم روودابە بمرێت." سیمۆرغ وتی: "مەترسە پزیشك دەبێ جێگای برینەکە بدۆرێتەوەو بە باڵی من برینەکە بماڵێت. دڵنیابە برینەکە زۆر زوو ساڕێژ دەبێتەوە." زاڵ شەربەتی هۆشبەری بەروودابە دا، بۆ ئەوەی روودابە بێهۆش بێت. پزیشکی تایبەت ئاگاداری لێ کردو سەرئەنجام روودابە منداڵەکەی بوو.

کاتێك کە پزیشك زگی ڕوودابەی دووریبیەوە، زاڵ باڵی سیمۆرغی لەسەر برینەکە ماڵی. پاش کاتژمێرێك ڕوودابە تەندروست و سالم هۆشیاری خۆی بەدەست هێنایەوە. زاڵ لەخۆشیاندا هاواری کردو وتی: "جەژنێکی گەورە ڕێکبخەن. کوڕەکەم ڕۆستەم بەتەندروستی لەدایك بووە." ڕۆستەم زۆر گەورەتر لە منداڵێکی ئاسایی بوو. بەجۆرێك کە دە ژن شیریان پێ دەداو کاتێك کە تۆزێك گەورەتر بوو بەقەد پێنج پیاو نانی دەخوارد. ڕۆژەکان تێپەڕ دەبوون تا ئەوەی کە ڕۆستەم بوو بەپیاوێکی لاو و بەهێز.





ڕۆژێك لەڕۆژان گەورە پیاوان و پاڵەوانان جەژنێکیان ڕێك خستبوو کە ڕۆستەمیش لەو جەژنەدا بەشداری کرد. کاتێك جەژنەکە تەواو بوو هەمووان بۆ شوێنی حەسانەوەی خۆیان گەڕانەوە، لەپڕا هاواری خەڵك بەئاسمان گەیشت. هەر کەس بەرەو لایەك ڕای دەکردو هەڵدەهات. ڕۆستەم پرسی: "چی بووە؟" سەربازێك وتی: "بەهانامانەوە بێن، فیلێکی سپی هار بووەو هەوسارەکەی پچڕاندووە. ئێستا خەریکە دانە بەدانەمان لەژێر مست و پێ لەقەدا دەپلیشێنێتەوە!" کاتێك کە ڕۆستەم ئەوەی بیست گورزەکەی باوکی هەڵگرت و هێرشی کردە سەر فیلەکە.



سەربازەکان ویستیان پێشی پێ بگرن و نەهێڵن ڕۆستەم بچێتە جەنگی فیلە هاربووەکەوە، بەڵام نەیانتوانی بی بەزێنن. ڕۆستەم هێرشی کردە سەر فیلەکەو گورزێکی وای بەسەریدا کوتا فیلەکە لەسەر خۆی چو و کەوتە سەر زەوی. کاتێک هەواڵەکە بەگوێی زاڵ گەیشت، بەهۆی لەنێوچوونی فیلەکەیەوە زۆر دڵگران بوو، بەڵام ئافەرینی لەئازایەتی و هێزی ڕۆستەم کرد و ناوچاوانی ماچ کرد. زاڵ وتی: "پێم وایە ئێستا ئەوەندە بەهێز و ئازا بوویی کاتی ئەوە هاتووە کە بۆ کێوی سپەند بڕۆی و تۆڵەی نەریمانی باپیرت لەدەسەڵاتداری ئەوێ بستێنیتەوە."

ڕۆستەم پرسیاری کرد: "کێوی سپەند لەکوێدایە؟"

زاڵ وتی: "لەسەر ئەو کێوەدا شارێکە کە دەوروبەری بەدیواری بەرز نەخشێندراوە، ئەو شارە تەنها دەرگایەکی گەورەی تێدایەو هیچ کەسێك ناتوانێت بە زۆر و جەنگاوەریەوە بچێتە ناو ئەو شارە. فەرەیدون پاشا، نەریمانی بۆ ئەوە نارد بچێتە ناو ئەو شارە، بەڵام پاشساڵێك شەر شکستی خواردو نەریمان کوژرا. پاش ئەو، باوە گەورەی، واتە سامی پاڵەوان هێرشی کردە سەر ئەوێ و دەوروبەری دیوارەکانی قەڵاکەی گەمارۆ دا. بەڵام کەس نە لەقەڵاکە هاتە دەرەوەو نە کەسیش توانی بچێتە ناو شارەکەوە. لەکۆتاییدا سامیش دەستی لەگەمارۆدانی قەڵاکە هەڵگرت و گەرایەوە. ئەوەشت پێ بڵێم کە خەڵکی ناو قەڵاکە هەموو شتێکیان هەیەو دەتوانن بۆ چەند ساڵێك بەئاسانی بژین بەبێ ئەوەی لەدیواری شارەکەیان بێنە دەرەوە."



ڕۆستەم پرسیاری کرد: "کەوایە لەکوێ کشتوکاڵ و ئاژەڵداری دەکەن؟" زاڵ وتی: "هەر لەوێدا، لەمەزراکانی دەوروبەری شارەکەیاندا. ئەوان تەنها یەك شتیان نییە. ئەویش خوێیە، ئەگەر وەکوو بازرگانی خوێ بۆ ئەوێ برۆی دەرگاکەت بەرووردا دەکەنەوەو دەتوانی وەکوو بازرگان لەگەڵ سەربازەکانت دا بچیتە نێو ئەو شارە. بەڵام مەترسیەکی گەورەیە. تۆ دەبێ بۆ بردنی کەلوپەلی جەنگی بۆ ناو قەڵاکە بیرێکی باشی لێ بکەیتەوە."



"پێتان وایە ئەو منداڵە لەسەرماو سەهۆڵبەندانی کوێستانەو لەنێو ئەو هەمووە ئاژەڵە دڕندەدا هێشتا زیندووە؟" پیرمەند وتی: "ئەگەر چارەنووس کەسێکە زیندوو ڕابگرێت، بەدڵنیاییەوە دەتوانێت زیندوو بێت. دەبێ بەخێرایی بیدۆزنەوە." سام وتی: "نا! لەوە ناچێت زیندوو مابێت!"



رۆستەم بۆ ماوەی هەفتەیەك بیری کردەوەو نەخشەی کێشا. رۆژی حەوتەم فەرمانی دا کە چەندین وشتر باری خۆیٚ ئامادە بکەن. سەربازەکان جلوبەرگی بازرگان لەبەر بکەن و کەوان و خنجێرەکانیان لەنێو گوێنووی خوێکاندا قایم بکەن. خۆیشی خنجێر و گورزێکی لەناو گوێنوە گەورەکانیدا شاردەوە. سەر ئەنجام رۆژی سەفەر گەیشت. رۆستەم و سەربازەکان پاش چەند هەفتە بەدیواری قەڵاکە گەیشتن. پارێزەرانی قەڵاکە هاواریان کرد: "کێی کورە؟ لەکوێرا هاتووی؟" رۆستەم نەراندی: "ئێمە بازرگانین و رێژەیەکی زۆر خوێمان هێناوە بۆ ئەوەی لەم شارەدا بیفرۆشین."

سەرۆکی قە؟ڵاکە کەسێکی بۆ پشکنینیان ناردە دەرەوە. پشکێنەر باری گشت وشترەکانی بینی و هاواری کرد: "راست دەکات ئەمانە بازرگانن و بارەکەیان تەنها خوێیە." سەرۆکی قەڵاکە دەرگا گەورەکەی کردەوەو رۆستەم و سەربازەکانی چوونە ناوەوە. خەڵکی شار شادومان بوون و دەستیان کرد بەکڕینی خوێ لەکاروانەکە.



کاتێك که شەو داهات، سەربازەکان، گورز و خنجێر و کەوانەکانی خۆیان لەنێو گوێنوە خوێکانەوە دەرهێنا. لەپڕا سەرۆکی قەڵاکە بینینی کە لەنێو گوێنوە

خوێکاندا گورز دەردێنن. سەرۆکی قەڵاکە شمشێرەکەی لەکێلانەکەی دەرهێناو هێرشی کردەسەر ڕۆستەم.



ڕۆستەم دەرفەتی پێ نەداو بەزەربەی گورزەکەی لەپێی خست و خێرا کوشتی. شەڕ دەستی پێکرد. ڕۆستەم و سەربازەکان هەتا بەرەبەیانی لەگەڵ سەربازەکانی قەڵاکەدا شەڕیان کردو سەر ئەنجام توانیان شکستیان پێ بهێنن.

بەم شێوەیە ڕۆستەم و سەربازەکانی سەرکەوتن. هەر لەبەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا ڕۆستەم سەردانی شوێنە جۆراو جۆرەکانی قەڵاکەی کرد. لەم نێوانەدا بەبینایەکی گەورە گەیشت کە لەبەردی گرانیت دروست کرا بوو. بیناکە دەرگایەکی ئاسنی گەورەی هەبوو قوفڵێکی گەورەی لێ درابوو. ڕۆستەم بەگورزەکەی قوفڵەکەی شکاند و چووە نێو بیناکەوە. لەنێو بیناکەدا سندوقێکی زۆر لەئاڵتوون و قاڵی هەورێشمی گران لەسەر یەك کەڵەکە کرابوون.

ڕۆستەم بەبۆنەی سەرکەوتنەکانیەوە نامەیەکی بۆ باوکی نووسی و پرسیاری لێی کرد: "ئێستا چی بکەم لەو هەمووە ئاڵتوونە؟"



پەیامنێری ڕۆستەم نامەکەی بەدەستی زاڵ گەیاند. زاڵ لەنامەیەکدا بۆ ڕۆستەمی نووسی: "هەزار وشترت بۆ دەنێرم. ئاڵتوونەکان و قاڵیە هەورێشمیەکان بار بکەو پاشان دیوارەکانی قەڵاکە بڕوخێنەو بەخێرایی بگەڕێرەوە." ڕۆستەم فەرمانی زاڵی جێ بەجێ کردو بۆ شارەکەی گەڕایەوە. زاڵیش بەبۆنەی سەرکەوتنی ڕۆستەمەوە شاری چراخان کردو جەژنێکی گەورەی ڕێکخست. لەو جەژنەدا خەڵك هەموویان دەستیان دایە شایی و هەڵپەڕکێ.

کۆتایی



چیرۆکە خۆشەکانی شانامە

# حەوت خوانی ڕۆستەم

شاکارەکانی ئەدەبیاتی ئێرانی بۆ منداڵان و تازەلاوان

لەنووسینی ئۆمیدی پەناهی ئازەر
وێنەکێش: مریەم سەقەفی



چیرۆکەکە لێرەوە دەست پێدەکات کە کەیکاوس پاشای ئێران وەسوەسە دەبێت هێرش بکاتە سەر مازەندەران .ئەو لەلایەن ئەرژەنگ شاو دێو سپییەوە بەدیل دەگیرێت. دێوە سپی، کەیکاوس و پاڵەوانانی دیکە کوێر دەکات و لەچاڵێکی قوڵدا زیندانیان دەکات. کەیکاوس لەرێگەی یەکێك لەسەربازەکانیەوە نامەیەك بۆ رۆستەم و زاڵ دەنووسێت و داوای یارمەتیان لێ دەکات.

ئێستاش درێژەی ئەو چیرۆکە: زاڵ بە رۆستەم دەڵێت: "کورم تەنها تۆ دەتوانی رزگاریان بکەیت." رۆستەم لەوەلامدا دەڵێت: "هەرچەند مەترسیدارە، بەلام ئەگەر ئێوە رێنمایم بکەن سبەی رۆژ بۆ مازەندەران دەرۆم." زاڵ وتی: دوو رێگا بۆ رۆیشتن بۆ مازەندەران هەیە. رێگای یەکەمیان مەترسیدار نییە، بەلام زۆر دوورە. ئەوە لەحاڵێکدایە کە رێگای دووهەم کە زۆر نزیکە، لەنێو کوێستانەوە تێپەر دەبێت و زۆر مەترسیدارە." رۆستەم وتی: "من دەمەوێت رێگای دووهەم بېرم. بەو هیوایەی سەر بکەوم." پاشان ماڵئاوایی لەدایکی کردو بە رێکەوت. رۆستەم رۆژێکی تەواو لەسەر ئەسپەکەی، رەخش غارغارێنی کرد. لەشەودا گەیشتە بێشەیەك. لەوێدا نانی خواردو خەوت. ماوەیەك دواتر شێرێك بە ئەسپایی نزیکی بووەوە. رەخش حیلاندی، بەلام رۆستەم لەخەو هەڵ نەستا. شێر هێرشی هێنا. رەخش لەسەر دوو پەلی خۆی راوەستاو هاتەسەر چنگ بەدەستی بەشێوەیەك بەسەر شێرەکەیدا کوتا کە دەستبەجێ خستی بەزەویدا. شێر بێ هۆش کەوت. رەخش بەخێرایی بەدیانی ملی شێرەکەی گرت و دیسان کێشایەوە بەزەویدا. شێرەکە هەر لەوێدا مرد.



کاتێك کە ڕۆستەم لەخەو هەستاو شێری مردووی بینی، بەسەر ڕەخشدا نەڕاندی: "بۆچی بە تەنهایی لەگەڵ شێردا بەشەڕ هاتی؟ لەوانە بوو شێرەکە بتکوژێت. دەبووایە منت لەخەو هەستاندایە!" ڕۆژی دواتر ڕۆستەم بە بیابانێکی وشك و بێ ئاو و ئالیك گەیشت کە زۆر گەرم بوو. ڕەخش کە ئیتر خەریك بوو لەتوونیەتیدا دەمرد، ڕاوەستا. ڕۆستەم لەسەر ڕەخش دابەزی و ڕاوەستاو تۆزێك بیری کردەوە. هەر لەو کاتەدا بزنە کێویەکی بینی. لەگەڵ خۆیدا وتی: "بەدڵنیاییەوە بزنەکێوی دەزانێ ئاو لەکوێدا هەیە. هەر بۆیە بەدوایدا چوو. پاش ماوەیەك بە کانیاوێك گەیشت. ڕۆستەم و ڕەخش لەو کانیاوە ئاویان خواردەوەو تینویەتی خۆیان شکاند.





کاتێک شەو داهات بەرەخشی وت: "من دەخەوم ئەگەر شێر یان دێوێک هات، خێرا لەخەو هەڵم بستێنە. بەتەنیایی لەگەڵیدا شەڕ نەکەیت." نیوە شەو لەپڕ ئەژدیهایەک لەتاریکیدا لەپشت چەند دارەوە دەرکەوت. رەخش حیلاندی. ڕۆستەم لەخەو هەستا، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە هیچی نەدی، بەڕەخشی وت: "بۆچی لەخەو هەڵت ساندم؟" بەڵام سەرلەنوێ رەخش حیلاندی.

هەر لەم کاتەدا، ئەژدیها لەپشت دارەکانەوە هاتەدەر و هێرشی کردە سەر ڕۆستەم. ڕۆستەم هاواری کرد: "ماڵئاوایی لەدنیا بکە، ئێستا گیانت دەکێشم!" ئەژدیها هاتە قسەو وتی: "ئەمە ناوچەو مێرگی منە، تا ئێستا هیچ گیانلەبەرێك نەیتوانیوە لەگەڵمدا ڕمبازێن بکات! ئێستا تۆ...!" لەپڕێکدا هێرشی هێنا.





ڕەخش کە گیانی ڕۆستەمی لەمەترسیدا دەدی، هەستایەوەو بەددانی لاقی ئەژدیهاکەی گرت. ڕۆستەم لەو دەرفەتە کەڵکی وەرگرت و بە شمشێرەکەی ئەژدیهاکەی کوشت. ڕۆستەم بەرەو ڕەخش چوو و دەستی بەسەریدا هێنا. ڕۆژی دواتر ڕۆستەم سواری ڕەخش بوو و درێژەی بە ڕێگاکەی دا. لەنزیك پاش نیوەڕۆدا ڕۆستەم بە کانیاوێکی جوان گەیشت. لەپاڵ کانیاوەکەدا سفرەیەکی ڕەنگین و ڕازاوە پان ڕاخرابوو و خواردەمەنیەکی زۆر لەسەر ئەو سفرەیەدا ڕیزکرابوو.

ڕۆستەم بە سەرسووڕمانەوە چووە پاڵ سفرەکەو چاوێکی بەدەوروپشتدا گێڕا، بەڵام کەسی نەبینی. ئەو سفرە لەلایەن ژنێکی جادووگەرەوە دانرابوو. کاتێك کە جادووگەر ڕۆستەمی بینی، خۆی لەرووخساری ژنێکی جواندا نیشان داو لەپشت دەوەنێکەوە هاتەدەر. دواتر بەڕۆستەمی وت: "فەرموون پاڵەوان، خواردەمەنیەکان بکە نۆشی گیانت." ڕۆستەم لەسەر سفرەکەدا دانیشت و ویستی نان بخوات. ژنە جادووگەرەکە زەرد هەڵگەڕا. ڕۆستەم کە توشی سەرسووڕمان ببوو، بەخێرایی کەوانەکەی خستە مل ژنەکەو وتی: "خێراکە بڵێ کێی و رووخساری راستەقینەی خۆت نیشان بدە، ئەگینا ئەتکوژم." لەپڕ رووخساری ژنەکە وەکوو پیریژنێکی ناشیرین دەرکەوت. ڕۆستەم رەحمی پێ نەکردو بەخنجێرەکەی هەر لەوێدا کوشتی.



ڕۆژی دواتر ڕۆستەم سواری ڕەخشەکەی بوو بەڕێکەوت. ڕێگایەکی دوور و درێژی بڕی تا گەیشتە مەڵبەندێك کەش و هەوایەکی خۆشی هەبوو. پشوویەکی دا. هەوسارەکەی ڕەخشیشی کردەوەو لەسەوزەڵانێدا بەریدا بۆ ئەوەی لە لەوەرگەدا بلەوەڕێ و ئەویش پشوویەك بدات. ڕەخش تۆزێك دوور کەوتەوە. لەو کاتەدا دەشتەوانێك گەیشت و بەدارێك دای لەپاشووی ڕەخش. ڕەخش حیلاندی. ڕۆستەم لەخەو هەستاو دەشتەوانی تەمێ کرد. دەشتەوان هەڵهات و چوو بۆ لای ئەولاد کە پاڵەوانی ئەو مەڵبەندە بوو.



ئەولاد لەگەڵ هاوڕێیانیدا هێرشی کردە سەر ڕۆستەم. ڕۆستەم توانی شکستیان پێ بێنێت و دەستی ئەولاد بەگوریسێك ببەسێتەوەو وتی: "ئەگەر جێگای دێوە سپیم پێ نیشان بدەی و بڵێی کە کەیکاوس و پاڵەوانەکانمان لەکوێدا زیندانی کراون، پاش سەرکەوتن دەتکەم بە پادشای مازەندەران. ئەگینا خۆت بۆ مردن ئامادە بکە، ئەولاد ملی پێداو وتی: "لێرەوە تا جێگای دێوە سپی شەسەد کیلومەتر ڕێگایەو دوازدە هەزار دێو پارێزگاری لەو زیندانە دەکەن. دێوی دیکەشی تێدایە، تۆ هیچ کاتێك ناتوانی بەسەر دێوە سپیدا سەربکەوی." ڕۆستەم زەردەخەنەیەکی لێ داو وتی: "ئەمە کێشەی تۆیە کە بەسەلامەتی هەتا ئەوێ بمبەی، ئەگینا بۆ خۆت دەزانی..."



دوای ئەوە خۆی سواری رەخش بوو و ئەولادیش بەقۆڵبەستکراوی و بەپێ بەدوای ئەودا دەڕۆشت. ئەوان بۆماوەی دوو رۆژ بەرێگادا رۆیشتن تا ئەوەی کە بەزیندانی دێوە سپی گەیشتن. رۆستەم پشوویەکی دا، پاشان ئەولادی بە دارێکەوە بەستەوەو بەخێرایی بەرەو سوپای ئەرژەنگی دێو بەرێکەوت و هێرشی کردە سەریان.



ئەرژەنگی دێو کاتێك کە دەنگ و هەرای دێوەکانی بیست کە زۆر ترسابوون، لەخێمەکەی هاتەدەر و هێرشی کردە سەر ڕۆستەم. ڕۆستەم کە چاوەڕوانی دەکرد، بەشمشێر لەنێوی برد. دێوەکانی دیکە کە کوژرانی ئەرژەنگی دێویان بینی، لەترسانا هەڵهاتن. ڕۆستەمیش کەوتە شوێنیان و ژمارەیەکی زۆر لەو دێوانەی کوشت. کاتێك خۆر ئاوا بوو، ڕۆستەم بۆ لای ئەولاد گەڕایەوەو قۆڵی کردەوەو ئازادی کرد. پاشان پشوویەکیان داو بەخێرایی بەرەو زیندانی کەیاقوس بەڕێکەوتن. کەیکاقوس کە دەنگی حیلەی ڕەخشی بیست. بەپاڵەوانەکانی وت: "شادومان بن، چونکە لەوانەیە ڕۆستەم بۆ ئێرە بێت. من دەنگی حیلەی ڕەخش دەناسم." زۆری پێ نەچوو ڕۆستەم بە ڕەخشەوە چووە نێو زیندان.



پاڵەوانانی ئێران، گودەرز، گیو، تووس، گۆستەهەم، شیروش، بەهرام و ئەوانی دیکە شادومان بوون و بەدەوری ڕۆستەمدا کۆبوونەوە. کەیکاوس وتی: "دەبێ بەخێرایی دێوە سپی لەنێو ببرێ، ئەگینا کاتێك کە هەواڵی کوژرانی ئەرژەنگی دێو بەگوێی بگات، گشت ئەم مەڵبەندە پڕ دەکات لەدێو. ئەو کاتە ئیتر هەڵهاتن لەدەست ئەو دێوانە بۆمان دژوار دەبێت. ئەو لەنێو ئەشکەوتێکدا دەژی کە حەوت کێو لەولاترە، لەهەر کام لەو کێوانەدا هەندێك دێو پارێزگاری دەکەن. پێویستە لەنێویان بەرین. کاتێك دێوە سپیت کوشت دڵ و مێشکی بۆ ئێمە بێنە. پزیشکەکان وتوویانە ئەگەر لەدڵ و مێشکی دێوە سپی دەرمانێك دروست بکەین و بەسەر چاوماندا بیماڵین، سەرلەنوێ بینایی خۆمان بەدەست دێنینەوە." ڕۆستەم کاتێك ئەو قسەیە بیست بە ئەولادی وت ڕێکەوە، بادرەنگ نەکەین و بۆ خۆی سواری ڕەخش بوو و ڕێکەوتن.



ڕۆستەم بەهەر کێوێک کە دەگەیشت، دێوەکانی پارێزەری ئەو کێوەی دەکوشت. کاتێک کە بەدوایین کێو گەیشت ئەولاد وتی: "دێوە سپی لەنێو ئەم ئەشکەوتەدا دەژی". ڕۆستەم بە ئەولادی وت: "تا ئێرە بەباشی منت ڕێنوێنی کردووە، ئەگەر دێوە سپی نهێنیەکی هەیە، پێم بڵێ با بتوانم بەسەریدا سەربکەوم." ئەولاد وتی: "کاتێک کە خۆر ئاوا دەبێت، دێوە سپی و گشت پارێزەرەکانی خەویان لێ دەکەوێ. بەدڵنیاییەوە سەرکەوتن بۆ تۆیە." ڕۆستەم چاوەڕوان مایەوە تا خۆر ئاوا بوو. ڕۆستەم سەرلەنوێ ئەولادی بەدارێکەوە بەستەوەو بەخێرایی هێرشی کردە سەر دێوەکانی پارێزەر و لەنێویانی برد. پاش ئەوە ڕۆستەم چووە نێو ئەشکەوتەکەوە.





لەناو ئەشکەوتەکەدا، دێوەسپی کێو وەکوو پەیکەرێك خەوی لێکەوتبوو. رووخساری دێوەکە وەکوو قیر رەش بوو. رۆستەم نەیویست لەخەودا بیکوژێت، چونکە ئەو کارە بەلایەوە جوامێرانە نەبوو. هەر بۆیە بەسەریدا نەڕاندی تا لەخەو هەستێت. دێوە سپی لەخەو هەستاو رۆستەم لەپڕ هێرشی کردەسەری. دێوە سپی، بەردێکی هەڵگرت و ویستی بەسەر رۆستەمی بدات، بەڵام رۆستەم وەکوو با هەڵهات و دەست و لاقێکی دێوەکەی بریەوە. دێو هەر بەو یەك دەست و یەك لاقەیشیەوە شەڕی دەکرد. ئەوان ئەوەندە پێکەوە شەڕیان کرد کە ئەشکەوتەکە پڕ بوو لە تەپ و تۆز. سەرئەنجام رۆستەم لەناکاو دێوە سپی بەرز کردەوەو بەتووندی بەعەرزیدا دا.
دواتر شمشێرەکەی دەرکێشاو دڵ و زگی دێوی لە لەشی دەرهێنا.

ڕۆستەم بۆ لای کەیکاوس و ئەوانی دیکە گەڕایەوە. دەرمانەکەی دروست کردو بەچاوی ئەوانیدا دا. کەیکاوس و پاڵەوانەکانی دیکە سەرلەنوێ بینایی خۆیان بەدەست هێنایەوەو لەخۆشحاڵیدا هاواریان دەکرد. ڕۆستەم بە ئەولادی ووت: "پاش سەرکەوتن بەسەر پادشای مازەندەران منیش پەیمانی خۆم بەجێ دێنم. دڵنیابە تۆ وەکوو پاشای مازەندەران دیاری دەکەم. پاشان هەموویان لەزیندانی دێوە سپی هاتنە دەرەوەو دەستیان کرد بەشایی و هەڵپەڕکێ و جەژنیان گێڕا.

کۆتایی



چیرۆکە خۆشەکانی شانامە

# رۆستەم و ئەفراسیاب

شاکارەکانی ئەدەبیاتی ئێرانی بۆ منداڵان و تازەلاوان

لەنووسینی ئومیدی پەناهی ئازەر
وێنەکێش: مرییم سەقەفی



لەکاتی پاشایەتی زەودا، بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەنێوان ئێرانیەکان و تورانیەکاندا پەیمانی ئاشتی بەسترا، بەڵام پاش مردنی زەو، پەشەنگ، پاشای تورانیان نامەی بۆ کوڕەکەی ئەفراسیاب نووسی کە "هەتا ئێران بێ پاشایەو هێشتا جێگرێکی بۆ پەیدا نەبووە، بەسوپایەکی گەورەوە هێرش بکە سەر ئێران و سەرانسەری ئەو وڵاتە بکە بەمەڵبەندی ژێر رکێفی خۆت."



ئەفراسیابیش سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد، کەشتیەکانی لەدەریاکاندا بەگەڕخست و بەرەو ئێران بەڕێکەوت. کاتێك هەواڵی هێرشی ئەفراسیاو بەزاڵ گەیشت، هەموو گەورە پیاوانی لەدەوری یەك کۆ کردەوەو وتی: "من ئیتر پیر بووم و ناتوانم وەك لاوێتیم فەرماندەیی سوپای ئێران بەئەستۆ بگرم، بەڵام باش دەزانم کە کوڕەکەم رۆستەم بەباشی دەتوانێت ئەو کارە لەئەستۆ بگرێت." کاتێك هەمووان لەگەڵ ئەوەدا رەزامەندیان دەربری، زاڵ بەرۆستەمی وت: "لەمرۆ بەولاوە تۆ جێگری منی. ئێمە کەسی بەهێزترو ئازاتر لەتۆمان نییەو بێجگە لەتۆ کەس بەشیاوی ئەو جێگاو شوێنە نازانین.



رۆستەم وتی:  من ئەسپێکی ئازاو بەهێزم دەوێ، لەگەڵ گورزێکدا کە کەس نەتوانێت بەرزی بکاتەوەو شەڕی پێ بکات." زاڵ فەرمانی دا گورزی باوکی، واتە گورزی سام بدەن بەرۆستەم.

***



ڕۆستەم لەناو ڕەوە ئەسپەکانی زاڵدا، بەچکە ماینێکی دیتەوە کە چاوێکی ڕەش و یاڵێکی جوان و لەشێکی بەهێزو سەر شێتی هەبوو. ڕۆستەم ئەو بەچکە ماینەی هەڵبژارد. شوانی تایبەتی ئەسپەکانی زاڵ وتی: "تا ئێستا هەر کەسێك  لەو بەچکە ماینە نزیك بۆتەوە، ماینەکە هێرشی کردۆتە سەری و کوشتوویەتی. ئەو بەچکە ماینە ڕێگا نادات کەس سواری بێت. تۆش لەبیری بکە." بەڵام ڕۆستەم بۆ نێو ڕەوە هەڵهات و بە کەوانەکەی بەچکە ماینەکەی گرت. بەچکە ماینەکە بەر بوو و بەملاو لا هەڵدەهات.

لەناکاو دایکی بەچکە ماینەکە لەدوورەوە شیڕاندی و بەرەو ڕۆستەم هێرشی هێنا. ڕۆستەم بەمست کێشای بە پشتە ملی ماینەکەداو دەوری لێدایەوە. پاشان پەڕییە سەر بەچکە ماینەکەو کەمێك غارغارێنی کرد. دواتر بەخۆشحاڵیەوە وتی: "من ئەم ئەسپە هەڵدەبژێرم و ناویشی دەنێم ڕەخش."



زاڵ سوپایەکی گەورەی بۆ شەر ئامادە کرد. پاشان گەورەپیاوانی لەدەوری یەك کۆ کردەوەو وتی: "دەبێ تا درەنگ نەبووە پاشایەك بۆ ئێران هەڵبژێرین. ئاگادارم کە پیاوێکی شایستە بەناوی کەیقۆباد لە کێوی ئەلبۆرزدا دەژی کە لەرەگەزی فەرەیدونە. دەبێ بەخێرایی بیدۆزینەوە بۆ ئەوەی بەسەر ئێراندا پاشایەتی بکات." هەر بۆیە داوای لەرۆستەم کرد لەگەڵ سەربازەکانی بۆ کێوی ئەلبۆرز برۆن و کەیقۆباد پەیدا بکەن. رۆستەم بەخێرایی بۆ " کێوی ئەلبۆرز" چوو. بەڵام لەرێگادا لەگەڵ گروپێکی گەورە لەسەربازانی ئەفراسیاب بەرەو روو بووەوە. رۆستەم ژمارەیەکی زۆریانی لەناو برد. ژمارەیەکیش هەڵهاتن و ئەفراسیابیان لەهێرشی رۆستەم ئاگادار کردەوە.



ئەفراسیاب توورە بوو و فەرمانی بە قۆلون، سەربازێکی ئازاو بەهێزی دا: "گروپێك لەئازاترین سەربازانی هەڵبژێرێ و بۆ کێوی ئەلبورز بڕوات و لەوێدا لەبۆسەدا دابنیشێت بۆ ئەوەی بتوانێت لەکاتی گەڕانەوەی ڕۆستەم و سەربازەکانیدا گیریان بێنێت و لەناویان ببات." لەو لاوە ڕۆستەم بە " کێوی ئەلبۆرز" گەیشت. مەڵبەندێکی شاخاوی کە کەشوهەوایەکی زۆر خۆشی هەیە. لەداوێنی " کێوی ئەلبۆرز"دا چەند لاوی بینی کە لەتەنیشت ڕووبارێکدا لەسەر گاشە بەردێك دانیشتبوون و شادو خۆشحاڵ پێکەوە گفتوگۆیان دەکرد.





ئەو لاوانە داوایان لەڕۆستەم کرد بڕوات بۆ لایان.
ڕۆستەم ووتی: "ئێمە بەدوای لاوێك بەناوی کەیقوباد دەگەڕێین". لاوێکیان پرسی: "کارتان چییە بە کەیقوباد؟" ڕۆستەم وتی: "ئەو لاوە لەرەگەزی فەرەیدونەو هەموو گەورەپیاوانی وڵات بڕیاریانداوە وەکوو پاشای ئێران دایبنێین.


ئەو لاوە قاقا پێکەنی و وتی: "من کەیقوباد، لەرەگەزی فەرەیدونم". ڕۆستەم بەهێمای ڕێزەوە سەری دانەواند و داوای لێکرد لەگەڵ هاوڕێیاندا بۆ ئێران بێن. بەم شێوەیە کەیقوباد و هاوڕێیانی لەگەڵ ڕۆستەم بەرەو ئێران بەڕێکەوتن.

بەڵام لەنیوەی ڕێگادا، قولون و سەربازەکانی کە لەبۆسەدا بوون، لەناکاو هێرشیان کردە سەریان. کەیقوباد ویستی شەڕ بکات، بەڵام ڕۆستەم وتی: "ئەوە کاری منە. ئێوە خۆتان مەخەنە مەترسیەوە." ئەوەی وت و بەرەو دوژمن هێرشی برد. ڕۆستەم یەک لەدوای یەک سەربازەکانی قولونی لەناو دەبرد. بەم بۆنەشەوە قولون تووڕە بوو و بەنێزەکەی هێرشی کردە سەر ڕۆستەم. ڕۆستەم خۆی لاداو نێزەکەی قولونی لەدەستی سەند.



قولون ویستی هەڵبێت، بەڵام ڕۆستەم بەنێزەکەی لەسەر عەرز بەرزی کردەوەو وەکوو مریشك کردی بەسەر نێزەکەدا. سەربازەکانی قولون کاتێك کە ئەم دیمەنەیان بینی، لەترسانا هەڵهاتن. کەیقوبادو سەربازەکانیشی بەباڵای ئازایەتی و هێزی ڕۆستەمدا هەڵیانداو شاییبیان گێڕا. ئەوان لەشەودا هەر لەو شوێنە پشوویەکیان داو ڕۆژی دواتر بەرەو ئێران بەڕێکەوتن. کاتێك بەئێران گەیشتن، زاڵ جەژنێکی گەورەی بەڕێخستبوو. ئەوان بۆ ماوەی هەفتەیەك شایی و خۆشییان گێڕا و ڕۆژی هەشتەم کەیقوبادیان لەسەر کورسی پاشایەتی دانا. چەند ڕۆژ دوای ئەوە کەیقوباد فەرمانی دا کە دەبێ لەگەڵ سوپای ئەفراسیابدا بەشەڕ بین.





ڕۆژی شەڕ گەیشت. هەر دوو سوپای ئێرانیەکان و تورانیەکان بەرانبەر بەیەکترین وەستان. ڕۆستەم لەپێش هەمووانەوە ئاڵای کاویانی بەدەستەوە گرتبوو. گۆستەهەم، کەشواد، مێهراب، قارێن و پاڵەوانانی ئێرانی دیکە لەپێشەوەی سوپای ئێراندا ئامادەی شەڕ ڕیزیان بەستبوو. هەموو جارێك کە قارێن هێرشی دەبرد چەند کەسی دەکوشت. ڕۆستەم چووە لای زاڵ و لێی پرسی: "رووخساری ئەفراسیاب چۆنەو ناونیشانی چۆنە؟" زاڵ وتی: "کوڕم ئەفراسیاب پیاوێکی فێڵبازە. ئاگات لەخۆت بێت! ئەو سەرپێچێکی پەمەیی بەسەرەوە پێچاوەو ئاڵاکەی ڕەشە." ڕۆستەم بەبێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدات هێرشی کردە سەر دوژمن. کاتێك کە چاوی بەئەفراسیاب کەوت هێرشی کردەسەری. کاتێك کە ئەفراسیاب ویستی خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات، ڕۆستەم بەگورز زەربەیەکی لێ داو قایشەکەی گرت. ڕۆستەم بەعەرزیدا دا بۆ ئەوەی بۆ لای قوبادی ببات.

کەیقوباد ئافەرینی بەڕۆستەم و زاڵ وت و بۆ دەربڕینی سوپاس و پێزانینی خۆی لەڕۆستەم و زاڵ لەدوو لای خۆیەوە دای نان. دواتر فەرمانی دا کە هەموو شوێنێکی ئێران چراخان بکرێت و جەژن و هەڵپەرکێ ڕێک بخرێ.

کۆتایی



لەچیرۆکی رووییَن قەڵادا باس لەوە دەکات کە گۆشتاسب پاشای ئێران بەکوڕەکەی وت: "ئەگەر بتوانی ئەرجاسب، پاشای تورانی شکست بدەی و خوشکەکانی رزگار بکەی، کورسی پاشایەتی بەتۆ دەدەم." بەڵام گۆشتاسب بەڵێنی خۆی بەجێ نەهێناو وتی: "کوڕم دوژمنی سەرەکی ئێمە رۆستەمە کە سەرپێچیکاری لێ دەرهاتووە! بڕۆ بۆ زابۆلستان قۆڵبەستی بکەو بیهێنە بۆ لامان." ئەگەر ئەم کارە بکەی سوێندت بۆ دەخۆم کە ئەم جارە دەتکەم بەپادشا.



ئەسفەندیار وتی: "بەڵام باوکە، ڕۆستەم هەمیشە یارمەتیدەری خەڵکی ئێران بووە. من چۆن دەتوانم قۆڵبەستی بکەم؟!" گۆشتاسب وتی: "ئەگەر دەتەوێ ببی بەپاشا دەبێ ئەو کارە بکەی." ئەسفەندیار بارگران بوو و چوو بۆ لای کەتایونی دایکی. کەتایون وتی: "گیانی خۆت مەخەرە مەترسیەوەو مەڕۆ بۆ شەڕ لەگەڵ ڕۆستەم . باوکت پیر و پاتاڵ بووە. ئێمەو گشت خەڵکی ئێران چاوی هیوامان بڕیوەتە تۆ."





ئەسفەندیار وتی: "من ڕۆستەم قۆڵبەست ناکەم، بەڵکوو داوای لێ دەکەم خۆی لەگەڵمدا بێت. بێجگە لەوە، خۆت باش دەزانی کە باوکم پاشایەو من ناتوانم سەرپێچی لەفەرمانی بکەم." کاتێك کە کەتایون دیتی ئەسفەندیار گوێ بەقسەکانی نادات و کێشای بەسەر خۆیداو بەر بوە گریان، ئەوەندە گریا کە لەسەرخۆی چوو.

ئەسفەندیار بەسوپاکەیەوە بەرەو زابول بەڕێکەوت. کاتێك گەیشتە لای هیرمەند بە بەهمەنی کوڕی وت: "بڕۆ بەڕۆستەم بڵێ بۆ لای ئێمە بێت." بەهمەن جلێکی پاشایانەی لەبەر کردو لەهیرمەندەوە پەڕیەوە هەتا بەشوێنی راوی زاڵ و ڕۆستەم گەیشت. کاتێك کە بەهمەن بەژن و بالآی بەهێزی ڕۆستەمی بینی، لەبیری خۆیدا وتی: "ئەگەر باوکم لەگەڵ ئەودا بەشەڕ بێت، بەدڵنیاییەوە ڕۆستەم سەردەکەوێت، کەوایە باشتر وایە پیلانێکی بۆ بگێڕم و بەو شێوەیە لەناوی ببەم."





هەر بەو بۆنەشەوە چووە سەر کێوێکی بەرزو بەردێکی گەورەی بەرەو ڕۆستەم تل کردەوە. هاوڕێیانی ڕۆستەم کاتێك کە بەردەکەیان دی هاواریان کردو هەڵاتن، بەڵام ڕۆستەم لەجێگای خۆیدا ڕاوەستاو بە پشتی قاچی ئاڕاستەی بەردەکەی بەرەو لایەکی دیکە گۆڕی. کاتێك کە بەهمەن دیتی پیلانەکەی سەر نەکەوت، چوو بۆ لای ڕۆستەم و پەیامەکەی باوکی پێ گەیاند.



ڕۆستەم وتی: "سڵاوی من بە باوکت بگەیەنەو پەیامی پێ بگەیەنە کە کەس ناتوانێت دەست و لاقی من ببەستێتەوە." بەهمەن بۆ لای باوکی گەڕایەوەو هەموو شتێکی بۆ گێڕایەوە.

ئەسفەندیار ئەم جارە بەسوپای سەد هەزار کەسی خۆیەوە لەڕووباری هیرمەند پەڕیەوە. ڕۆستەم بەرەو پێشوازی چوو و بەخێرهاتنی کرد. ئەسفەندیار وتی: "ئەی ڕۆستەم با قۆڵبەستت بکەم و بەقۆڵبەست کراویی بۆ لای باوکم بتبەم، دڵنیا بە کە ڕێگا نادەم کەس تاڵێك لەقژیشت هەڵکەنێ. چونکە ئەو کات من دەبمە پاشاو هەر شتێکت بوێت بۆت دەکەم.




ڕۆستەم وتی: "هەتا زیندوو بم ناهێڵم کەس قۆڵبەستم بکات."
ئەسفەندیار وتی: "کەوایە خۆت بۆ شەڕ ئامادە بکە. سبەی ڕۆژ
لەتەنیشت ڕووباری هیرمەندا یەکترین دەبینینەوە. ڕۆستەم
نیگەران بوو و بۆ شوێنەکەی خۆی گەڕایەوە.

ڕۆژی دواتر ڕۆستەم و ئەسفەندیار لەپاڵ هیرمەنددا بەرەو ڕووی یەکتر وەستان. ڕۆستەم بە ئەسفەندیاری وت: "تۆ هێشتا لاوی و خەریکی تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبی. من شەسەد ساڵ تەمەنمە. لەگەڵ پاشاو دەربارێکی زۆردا شەڕم کردووە... هەر لەو ڕێگایەوە کە هاتووی، بگەڕێوە." ئەم قسانە بەگوێی ئەسفەندیاردا نەچوو و جەنگێکی قورس لەنێوانیاندا هاتە ئاراوە. تێك هەڵچوونەکان دەستییپێکرد. ئەو دووانە ئەوەندە پێکەوە شەڕیان کرد کە شمشێرەکانین شکاو بە نێزەو گورز درێژەیان بەشەڕەکەیان دا، بەڵام نێزەکانیش شکا. ڕۆستەم تیروکەوانەکەی ئامادە کردو ئەسفەندیاریش بە تیروکەوانەوە بەرەو ڕۆستەم تیری هاویشت، لەیەك کاتدا دەیان تیریان بەرەو یەکترین هاویشت. تیرەکان لەشی ڕۆستەم یان دادڕی، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە ئەسفەندیار گیان پۆڵا بوو، هیچ تیرێك نەیتوانی بریندراری بکات. ڕۆستەم بەخێرایی لەرەخش دابەزی و چووە بان بەرزایی کێو و هاواری کرد: "هەی ئەسفەندیار ئێستا ئیتر هەوا لێڵ بووە، بەرەبەیانی سبەی ڕۆژ سەرلەنوێ لەتەنیشت ڕووباری هیرمەنددا یەکترین دەبینینەوە." ئەسفەندیاریش کە ماندوو ببوو، ڕازیبوو گەڕایەوە بۆ کەمپەکەی.





زەوارە برای رۆستەم چووە لای
زال و وتی: "باوکە، رۆستەم برینێکی زۆر بۆتە جەستەی،
خێراکە خۆتان بگەیەنن." زاڵ کاتێك کە لەسەر کێوەکەدا رۆستەمی
بینی، ئاگرێکی هەڵکردو تۆزێك پەڕی سیمۆرغی لەنێو ئاگردا سووتاند. زۆری
نەخایاند کە سیمۆرغ هەڵفڕی و لەتاریکی شەودا پەیدای بوو و لەپاڵ زاڵدا دانیشت، سیمۆرغ
وتی: "بۆچی خەمگین و بارگرانی و چ کارێکت بەمن هەیە کەبانگهێشتت کردووم؟! زاڵ هەموو
بەسەرهاتەکانی بۆ سیمۆرغ گێڕاوە. سیمۆرغ خۆی گەیاندە لای رۆستەم و بە دەنوکی
تیرەکانی ئەسفەندیاری لە لەشی رۆستەم و رەخش دەرهێنا. پاشان باڵی خۆی بە برینەکانی
ئەوانداماڵی. لەناکاو و بەخێرایی برینەکان سارێژ بوونەوە. رۆستەم وتی: "
سیمۆرغ بۆ ئەوەی سەربکەوم رێگاچارەیەکم بۆ بدۆزەرەوە، ئەگینا سبەی
رۆژیش وەکوو ئەمرۆ دەیدۆڕێنم."



سیمۆرغ وتی: "ئەگەر بەڵێن بدەی کە لەخۆبایی نەبیت پێت دەڵێم". ڕۆستەم سوێندی خوارد. سیمۆرغ وتی: "لەم دارە گەزە لقێك ببڕەوەو دوو تیر بەسەر یەکەوە ببەستە. بەڵام سبەی داوا لەئەسفەندیار بکە کە لەشەڕکردن دەست هەڵبگرێت. ئەگەر ملی پێ نەدا بەکەوانەکەت ئەم تیرە بەرەو ئەسفەندیار بهاوێژە. لەبیرت نەچێت کە ئەسفەندیار پاڵەوانێکی دلۆڤانەو ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ئەمڕۆ بتکوژێ، کەوایە کاتێك سەرکەوتی لەگەڵیدا بەدلۆڤانیەوە هەڵسووکەوت بکە." پاش ئەو گفتوگۆیە سیمۆرغ هەڵفڕیوی و لەوێ دوور کەوتەوە.



سبەی ڕۆژەکەی کاتێك کە ڕۆستەم و ئەسفەندیار بەرەو ڕووی یەکتر وەستان، ئەسفەندیار بەسەرسووڕمانەوە وتی: "زال چ ئەفسونێکی کردووە کە تۆ بەو شێوەیە تەندروست ماویتەوە، ئەگینا هەر ئێستا دەبێ بچیتە چاڵ!" ڕۆستەم وتی: "بۆ ڕەزای خوا دەست لەشەڕ هەڵبگرە. هەرچی سامان و سەروەتم هەیە پێتی دەدەم و خۆم دەچمە لای پاشا گۆشتاسب". ئەسفەندیار وتی: "دەبینم کە ترس سەرتاپای گیانتی داگرتووە! خێراتر ئامادەی جەنگ بەو زیاتر لەوە قسە مەکە." ڕۆستەم تیرێکی خستە نێو کەوانەکەی و وتی: ئەسفەندیار دەست لەشەڕ هەڵناگرێت و ئاشتی ناکەیت؟، لەوەدا من بەر پرسیار نیم!" بەو شێوەیە تیری تەقاند. تیر بەخێراییەکی زۆر چاوی ئەسفەندیاری کون کرد. لەناکاو دنیا لەبەرانبەر ئەسفەندیاردا تاریك و لێڵ بوو و لەئەسپەکەی کەوتە خوارەوەو لەسەرخۆی چوو. بەهمەن و پەشوتەن برای ئەسفەندیار، هاتنە سەر ئەسفەندیار و دەگریان.

ڕۆستەمیش لەپاڵ ئەسفەندیار دانیشت و گریا. ئەسفەندیار وتی: "ئەی پاڵەوان مەگری کە تۆ هیچ تاوانێکت نییە، باوکم بۆ ئەوەی کە تەخت و بەختەکەی بپارێزێت منی بۆ شەڕ لەگەڵ تۆ نارد کە بکوژرێم، ئێستا داوات لێ دەکەم ئاگات لەکورەکەم، بەهمەن بێت و هونەری شەڕکردن و مەردایەتی فێر بکە. ڕۆستەم بەڵێنی بەئەسفەندیار دا کە وەکوو کوڕی خۆی ئاگای لەکوڕەکەی بێت. پاش ماوەیەك ئەسفەندیار گیانی دەرچوو وماڵئاوای لەژیان کرد. ڕۆستەمیش سوپای بە پەشوتەن سپاردو لەگەڵ خۆی بەهمەنی بۆ ناوچەکەی خۆیان برد.

کۆتایی



چیرۆکە خۆشەکانی شانامە

# ڕۆستەم و ئەکوانی دێو

شاکارەکانی ئەدەبیاتی ئێرانی بۆ منداڵان و تازەلاوان

لەنووسینی ئۆمیدی پەناهی ئازەر
وێنەکێش: ئەمیر ئەکبەر





ڕۆژێك لەڕۆژان کەیخەسرەو پاشای ئێران لەکۆشکەکەیدا ئاهەنگی ئەگێڕ. چەند پاڵەوانێکی وەکوو گودەرز، تووس، بۆرزین، گۆستەهم، گیو، ڕۆهام، خەڕادو گورگینیش لەو ئاهەنگەدا بەشدار بوون. هەمووان خەریکی رابواردن بوون، کە لەناکاو سەرۆکی شوانەکانی کۆشك بەپەلەو شڵەژاو هاتە ژوورەوەو وتی: "ئەی خاوەن شکۆ بەهانامانەوە بێن! چەند ڕۆژە ئاژەڵێکی سەیر کە وەکوو کەرەکێوی وایەو ڕەنگی لەشی زێڕییە، بەڵام زۆر گەورەیەو هێرش دەکاتە سەر ڕەوەکانمان و بەددانی تیژی خۆی ئەسپەکانمان پارچە پارچە دەکات." کەیخەسرەو وتی: "دڵنیام لەوە کە ئەو ئاژەڵە کەرەکێوی نییە، چونکە کەرەکێوی زۆری بەسەر ئەسپدا ناشکێت. لەوانەیە ئیکوانی دێو بێت کە لەو دەوروبەرەدا دەژی." دواتر رووی کردە پاڵەوانەکان و پێیانی وت: "کامتان دەتوانێ بۆ شەڕی ئێکوانی دێو بڕوات؟"

پاڵەوانان بێ دەنگەیان لێ کرد. کەیخەسرەو وتی: "پێم وایە تەنها ڕۆستەم دەتوانێ ئێکوانی دێو ببەزێنێت."

دواتر نامەیەکی نووسی و بۆ ڕۆستەمی نارد. کەیخەسرەو لەو نامەیدا نووسی: "ئەی پاڵەوانی پاڵەوانەکان، ئێکوانی دێو وەکوو لافاو هەڵچووە. ئەمڕۆ هێرشی کردۆتە سەر ئێمە، ئەگەر دەست لەسەر دابنێین و کارێك نەکەین بەدڵنیاییەوە سبەی ڕۆژ هێرش دەکاتە سەر شارەکانی ئێران و خەڵکی ئەم مەڵبەندە. داوات لێ دەکەم بەخێرایی خۆت بەئێرە بگەیەنیت."

کاتێك ڕۆستەم نامەی کەیخەسرەوی بەدەست گەیشت و خوێندیەوە، بەخێرایی خۆی گورج کردەوەو شەوڕۆژ بەسواری ڕەخشەکەی بەغارغاران خۆی بە کۆشکی کەیخەسرەو گەیاند. کەیخەسرەو هەرچی زانیاری سەبارەت بەئێکوانی دێو هەبوو، بۆ ڕۆستەمی باسکرد. ڕۆژی دواتر ڕۆستەم بەبێ هیچ سوپایەك بەرەو مێرگوزاری دێو بەڕێ کەوت. ***



ڕۆستەم چەند ڕۆژ ڕێگای بڕی تا بەو مێرگوزارە گەیشت. ڕۆستەم ویستی پشوویەك بدات کە لەناکاو دێو وەکوو با لەبەرچاویەوە تێپەڕ بوو. ڕەخش بەدوای دێودا غاری دا. دێو بۆ ماوەی ڕۆژێکی تەواو بەدەشت و دەرا ڕۆستەمی بەدوای خۆیدا کێشا. بەڵام لەناکاو لەبەرچاوی ڕۆستەم ون بوو. ڕەخشەکەی ڕۆستەم کە کەوتبووە هەناسە بڕکێ، ڕاوەستا.



ڕرۆستەمیش کە زۆر ماندوو بوو، لەرەخش دابەزی. نانێکی خوارد و لەپاڵ کانیاوێکدا خەوت. پاش کاتژمێرێك ئێکوانی دێو سەرلەنوێ پەیدا بووەوەو ورتە ورتە چووە سەر سەری ڕۆسەم.

ڕەخش حیلاندی، بەڵام ئێکوانی دێو بەخێرایی ڕۆستەمی بەرز کردەوەو لەسەر سەری خۆیدا ڕایگرت. ڕۆستەم لەبیری خۆیدا وتی: "ئیتر ئەمە کۆتایی ڕێگایە. ئەو هەمووە تێکۆشەری و ئازایەتیە بەکۆتایی گەیشتووە. ئیستا ئیتر دەبێ ماڵئاوایی لەدونیا بکەم. نەفرەت لەمن کە بێ ئەقڵیم کرد. دەبێ لەحەشارگەیەکدا بخەوتمایە! بۆ ئەوەی دێو نەیتوانیایە بمدۆزێتەوە!" دێو زەردەخەنەیەکی لێ داو وتی: "دەبینم کە لەترسانا شێت بوویی و سوور هەڵگەڕاوی و وڕاوە دەکەی؟! پێم وابوو کە ڕۆستەم بەقەد زۆرەکەی عەقڵیشی هەیە. بەڕاست تۆ بۆ ئەوەندە بەدوای شەڕو خوێن ڕشتندای؟!" ڕۆستەم ویستی قسەیەك بکات کە ئیکوانی دێو وتی: "خێراکە بڵێ، بزانم حەز دەکەی بتخەمە نێو کوێستانەوە یان بتخەمە نێو دەریا؟ حەز لەکامیان دەکەی؟" "ڕۆستەم تۆزێك بیری کردەوەو وتی هەرچی بڵێی بەدێو، پێچەوانەکەی بەڕێوە دەبات. ئەگەر بکەومە نێو دەریا لەوانەیە ڕزگارم بێت." دێو وتی: "خۆ لەترسا زمانت وشك بووە، زووکە هەڵی بژێرە!" ڕۆستەم وتی: "بیستوومە کەسێك کە لەدەریادا بمرێت بۆ بەهەشت ناڕوات. کەوایە بمخە نێو کوێستانەوە با لەوێ بمرم."



دێو زەردەخەنەیەکی لێ داو وەکوو با ڕۆستەمی بردە سەر دەریاو لەئاسمانەوە خستیە نێو دەریاوە. پاشان نەڕاندی و قاقایەکی لێداو ون بوو. پاش ساتێك کوسە ماسیە برسیەکان ڕۆسەمیان بینی و وەکوو گورگی دڕندە هێرشیان کردە سەری کە بیخۆن. ڕۆستەم شمشێرەکەی لەکێلانەکەی دەرکێشاو بێ وچان لەگەڵیاندا شەڕی دەکرد.



ڕۆستەم خۆی گەیاندە پاڵ کەنارەکانی دەریاو گەڕایەوە بۆ پاڵ کانیاوەکە. تەواوی کەلوپەلەکەی لەوێدا بوو، بەڵام ڕەخش لەوێدا نەبوو. کەلوپەلەکەی هەڵگرت و بەرەو ئەوبەری دەشتەکە بەڕێکەوت.



پاش ماوەیەك ڕەوەیەك ئەسپی بینی، ڕەخشیش لەناویاندا بوو و خەریك بوو دەلەوەڕا. ڕەوە ئەسپەکە هی ئەفراسیاب پاشای تورانیەکان بوو. ئەفراسیاب و سەدان کەس لەسەربازان و حیمایەکانی لەو نزیکانەدا کەمپێکیان دروست کردبوو. ڕۆستەم وردە وردە خۆی بەرەوە ئەسپەکە گەیاند. بازی بردە سەر ڕەخش و لەگەڵ خۆیدا ڕەوەکەی بەرەو ئێران برد. کاتێك کە شوانی ڕەوەکە ڕۆستەمی بینی لەترسانا هەڵهات و سەربازەکانی ئەفراسیابی ئاگادار کردەوە. ئەفراسیاب تووڕە بوو و فەرمانی هێرشی بە سەربازەکانی دا. سەربازەکان سوواری فیلی جەنگی بوون و بەرەو ڕۆستەم تاویاندا. ڕۆستەم کاتێك کە ئەفراسیاب و سەربازەکانی بینی ڕەوە ئەسپەکانی لەبیر بردەوەو بەغار بەرەو ئەوان چوو.



ڕۆستەم بەگورز و شمشێر یەك لەدوای یەك لەپێیانی دەخست و لەئەفراسیاو نزیك دەبووەوە. ئەفراسیاب کە بینی بێجگە لەهەڵهاتن چارەیەکی تر نییە، لەگەڵ ژمارەیەك لەحیمایەکانیدا هەڵهات. ڕۆستەمیش دەستی بەسەر دەسکەوت و فیلە شەڕکەرەکانی ئەواندا گرت و لەگەڵ خۆیدا بردی. کاتێك کە گەیشتنە نزیك کانیاوەکە لەناکاو دەنگی نەڕەیەکی سامناك لەدەشتەکەدا دەنگی دایەوە. ڕەخش حیلاندی. ڕۆستەم سەری بەرەودوا سووڕاندەوە، لەپشت خۆیدا ئێکوانی دێوی بینی.





دێو هاواری کردو ووتی: "وادیاره هێشتا زیندوو ماویتەوە! چۆن توانیوتە لەدەست کوسە ماسیە درندەکان هەڵبێیت؟" رۆستەم وتی: "هەڵنەهاتم، شەرم کرد." دێو ووتی: "ئێستا خۆت بۆ مردن ئامادە بکە!" ئەم جارە رۆستەم گوریسەکەی خستە ملی دێو و بەگورزەکەی زەربەیەکی وای بەسەریدا دا کە دێو بەیەکجاری کەوتە سەر زەوی. کەیخەسرەو بەرۆستەمی وت ئەگەر سەری دێو لە لەشی جیا نەکەیتەوە، سەرلەنوێ زیندوو دەبێتەوە. هەر بۆیە سەری دێوەکەی لەلەشی جیا کردەوە. رۆستەم بەسەرسوورمانەوە بینی کە دووکەڵ و شلەمەنیەکی سەوز لەسەر و لەشی دێو دێتە دەرەوە.

دوای کاتژمێرێك ڕۆستەم بەهەموو دەسکەوتە جەنگیەکان، ڕەوەکانی ئەسپ و فێلەکانی ئەفراسیابەوە بەرەو ئێران بەڕێ کەوت. کاتێك کەیخەسرەو هەواڵی سەرکەوتنی ڕۆستەمی بیست، فەرمانی دا بۆ پێشوازی کردن لەڕۆستەم شار چراخانی بکەن و بیڕازێننەوەو لەهەموو شوێنێك جەژن و شایی و هەڵپەڕکێ بگێڕن.

دواتر بۆ خۆی بۆ پێشوازی کردن لەڕۆستەم بۆ دەروازەی شار چوو. ڕۆستەم بۆ ماوەی دوو هەفتە لەکۆشکی کەیخەسرەودا میوان بوو. ئەو هەمووە بەسەرهاتەی خۆی بۆ پاشا گێڕایەوە. کەیخەسرەویش بەهۆی ئازایەتی ڕۆستەمەوە وەکوو پاداشت ئاڵتوونێکی گران قیمەتی پێ پێشکەش کرد.

کۆتایی

